بەشێک لە :



# كِتاب أُصُول السّنَة

لأبي عبدالله ابن أبي زَمَنِين المالكِي الأندلُسي

(٣٢٤ - ٣٩٩ هـ)



عبدالملك الأثري

١٤٤٥ هـ

بەشێک لە :



# كِتابُ أُصُولِ السُّنَّةِ

لأبي عبد الله إبن أبي زَمَنِين المالكي الأندلُسي

(٣٢٤ - ٣٩٩ هـ)



عبد الملك الأثري

١٤٤٥ هـ

١ - **إبن أبي زَمَنِين المالكي** لە پێشەکی کتێبی أصول السنة دا ئەڵێت :

یەکێک لە ئارەزوومەندانی شوێنکەوتنی سوننەت و جەماعەت داوای لێ کردم ئەو فەرموودەیانەی بۆ بنووسم کە شوێنکەوتنی سوننەت و جەماعەت ی ئیمامە شوێنپێ هەڵگیراوەکان پیشان ئەدات، وە ئەوەی عەقیدەیان بووە و وتوویانە لە بابەتی ئیمان بە قەدەر، عەزابی قەبر، حەوز - ی کەوثەر - ، تەرازوو، پردی صیراط، دروستکردنی بەهەشت و جەهەننەم، گوێڕایەڵیکردن، شەفاعەت و تەماشاکردنی الله عز وجل لە قیامەتدا، وە منیش بە نووسینی ئەم کتێبە وەڵامم دایەوە.

وە حەزی نووسینی کتێبەکەم زیادی کرد کاتێک بینیم هێندە پەرۆشە بۆ فێربوونی ئەوەی کە پێویستە لەسەری فێری ببێت، وە عوزر بۆ نەزان نییە لە وازهێنانی لە پرسیارکردن و بەدواداچوونی ئەسڵەکانی ئیمان و دین، چونکە الله تعالی بەم وتەیەی پێویستی کردووە لەسەری : ﴿ **فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ** ﴾ (النَّحۡلِ : ٤٣) .

وە بە هەمان شێوە عوزر و بیانوو بۆ هیچ زانایەک نییە لە شاردنەوەی ئەوەی پرسیاری لەبارەوە لێ ئەکرێت جا لە قورئاندا بێت، یان لە سوننەتدا لە بەرامبەر ئەو کەسەی کە نایزانێت، لەبەر ئەو پەیمانەی کە الله تبارک و تعالی لە زانایانی وەرگرتووە : ﴿ **لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكۡتُمُونَهُۥ** ﴾ (آلِ عِمۡرَانَ : ١٨٧) .

٢ - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرموێت :

رسول الله ﷺ خەتێکی بۆ کێشاین، وە فەرمووی : ئەمە (ڕێگەی الله یە)، پاشان خەتی لە ئەملا و ئەولای خەتەکە کێشا و فەرمووی : (ئەمەش ڕێگاکانی ترن،

لەسەر هەر ڕێگایەک شەیتانێک هەیە بانگەواز ئەکات بۆلای) پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ (الأنعام : ١٥٣).

٣ - رسول الله ﷺ ئەفەرموویت :

(هەموو بیدعەیەک گومڕاییە).

٤ - ئیمام عمر بن الخطاب رضي الله عنه ئەفەرموویت : کۆمەڵەیەک دێن بە موتەشابیهی قورئان قسەتان لەگەڵ ئەکەن، ئێوەش بە سوننەتەکان قسەیان لەگەڵ بکەن، چونکە هاوەڵانی سوننەت زاناترن بە قورئان.

٥ - ئیمام عمر بن الخطاب رضي الله عنه ئەفەرموویت : هاوەڵانی ڕەئی دوژمنی سوننەتەکانن، لەسەریان قورس بوو لەبەری بکەن و نەیانتوانی لێی تێبگەن، وە شەرمیان ئەکرد کاتێک پرسیارێکیان لێکرا بڵێن : نازانین، جا لەبەر ئەوە بە ڕەئی خۆیان دژی سوننەتەکان وەستانەوە.

٦ - ئیمام علي بن أبي طالب إبن عباس ی رضي الله عنهم نارد بۆ کۆمەڵەیەک لە خەواریج، وە پێی وت : ئەگەر موناقەشەیان لەگەڵ کردیت بە قورئان، تۆ موناقەشەیان لەگەڵ بکە بە سوننەت.

---

: ئەم ئەثەرانە پێگە و گەورەیی سوننەت ڕوون ئەکەنەوە، گروپە گومڕاکان هەمیشە قورئان بەکار ئەهێنن بۆ شەرعاندنی گومڕایی و کوفرەکەی خۆیان بەوەی کە تەفسیری بۆ ئەکەن بە هەوا و

ئارەزووی خۆیان، بەڵام قورسە هەمان شت بکەن لەگەڵ سوننەتدا چونکە سوننەت خۆی ڕوونکەرەوەی قورئان ـە.

٧ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (هیچ دڵێک نییە ئیللا لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی پەروەردگاردایە، ئەگەر بیەوێت جێگیری بکات، جێگیری ئەکات، ئەگەر بیەوێت لایبدات، لایئەدات).

٨ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (شەیتان دێت بۆلای یەکێکتان و ئەڵێت : کێ ئاسمانی دروست کرد ؟

- کەسەکە - ئەڵێت : الله.

ئەڵێت : کێ زەوی دروست کرد ؟

- کەسەکە - ئەڵێت : الله .

ئەڵێت : کێ الله ی دروست کرد ؟

ئەگەر کەسێک لە ئێوە ئەمەی بەسەرهات با سێجار بڵێت : ئیمانم هێناوە بە الله و رسول ـەکەی) .

٩ - **أبو عبدالله محمد بن أبي زمنين** (**٣٢٤ - ٣٩٩** هـ) المالكي ئەڵێت :

وە لە عەقیدەی ئەهلی سوننە هەیە کە : الله عز وجل عەرشی دروست کرد، وە تایبەتی کرد بە بەرزی و بڵندی بەسەر هەموو دروستکراوەکانی تردا، پاشان بەرزبوویەوە (استوی) بۆسەری بە هەر شێوەیەک کە خۆی ویستی، وەک چۆن دەربارەی خۆی فەرموویەتی :

| ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ * لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَمَا تَحۡتَ ٱلثَّرَىٰ | (طه : ٥ - ٦) .

وە ئەفەرموویت : | ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۚ يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَاۖ | (الحَدِيِ : ٤) .

جا پاک و بێگەردی بۆ ئەوەی کە هێندە دوورە نابینرێت، وە بە عیلم و قودرەتی خۆی هێندە نزیکە چپە ئەبیستێت.

١٠ - إبن عباس رضي الله عنهما ئەفەرموویت : ئەو کورسیەی کە فراوانە بە فراوانی ئاسمانەکان و زەوی جێگەی دوو پێ - الله تعالى - ە، وە کەس گەورەیی نازانێت عەرش تەنها ئەوە نەبێت کە دروستی کردووە .

١١ - رسول الله ﷺ ئەفەرموویت : (وتم بە جبریل : ئایا پەروەردگارت بینیوە ؟ وتی : ئەی محمد، لە نێوان ئەو و من دا حەفتا پەردە هەیە لە نوور، ئەگەر نزیکی یەک دانەشیان بکەومەوە ئەوە ئەسووتێم) .

١٢ - رسول الله ﷺ ئەفەرموویت : (هیچ یەکێک لە ئێوە نییە ئیللا الله قسەی لەگەڵدا ئەکات، لە نێوانیاندا هیچ وەرگێڕێک نییە) .

١٣ - يحيى بن معين لە تەفسیری ئایەتی : | وَلَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ : وە ڕۆژی قیامەت قسەیان لەگەڵدا ناکات | (البقرة : ١٧٤) دا

ئەڵێت : بەو شێوەیە قسەیان لەگەڵدا ناکات کە پێیان خۆشە، ئەگینا قسەیان لەگەڵدا ئەکات، وە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ئەکات لە کار و کردەوەکانیاندا و بە کردەوەکانیان ئەیانگرێت - واتە کافران - .

**١٤ - جرير بن عبدالله** البجلي رضي الله عنه ئەفەرمووێت : شەوی مانگی چواردە

لەگەڵ رسول الله ـدا ﷺ بووین، فەرمووی : (ئەو مانگە ئەبینن ؟)، وتمان : بەڵێ، فەرمووی : (بە هەمان شێوە پەروەردگارتان ئەبینن ڕۆژی قیامەت، هیچ ئاستەنگیەکتان تووش نابێت لە بینینی) .

**١٥ - صهيب الرومي** رضي الله عنه ئەڵێت : رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەر کە ئەهلی بەهەشت چوونە بەهەشتەوە، بانگ ئەکرێن : (ئەی ئەهلی بەهەشت، ئێوە مەوعیدێکتان هەیە) . ئەڵێن : مەوعیدەکە چییە ؟ ئەی ڕووی سپی نەکردین ؟ وە نەیخستینە ناو بەهەشتەوە ؟ وە لە ئاگر ڕزگاری نەکردین ؟ فەرمووی : (جا پەردەکە لادەدات و دەرئەکەوێت - واتە الله تعالى - و تەماشای ئەکەن، سوێند بە الله، الله هیچ شتێکی نەداونەتێ خۆشەویستر بێت بەلایانەوە لەمە.

پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾ (يونس : ٢٦) .

**١٦ - عامر بن سعد البجلي** ئەڵێت : أبو بكر الصديق ئەم ئایەتەی خوێندەوە، یان بۆی خوێندرایەوە ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾ فەرمووی ئایا ئەزانن **الزِيَادَةٌ** چییە ؟ **الزِيَادَةٌ** بریتیە لە تەماشا کردنی ڕووی پەروەدگارمان .

**١٧ - قتادة** لە تەفسیری ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ﴾ ـدا ئەڵێت : نەرم و جوان .

وە لە تەفسیری | إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ | دا ئەڵێت : تەماشای الله ئەکات .

١٨ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (هەر یەکێک لە ئێوە کاتێک مرد - لە گۆڕدا - شوێنەکەی پیشان ئەدرێت لە بەیانیان و ئێواراندا ، ئەگەر لە ئەهلی بەهەشت بوو ئەوە لە شوێنی ئەهلی بەهەشتی پیشان ئەدرێت، وە ئەگەر لە ئەهلی ئاگر بوو ئەوە لە شوێنی ئەهلی ئاگری پیشان ئەدرێت، جا پێی ئەوترێت : ئەمە شوێنەکەتە هەتا الله ڕۆژی لەسەری زیندووت ئەکاتەوە) .

١٩ - قتادة لە تەفسیری ئایەتی : | وَجَاءَ مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَىٰ : وە پیاوێک لەو سەری شارەوە بە خێرایی هات | (یس : ٢٠) دا ئەڵێت : پێم گەیشتووە ئەوە پیاوێک بوو کە الله ی ئەپەرست، پاشان باسی بەسەرهاتەکەی کرد هەتا گەیشتە وتەی : | فَاسْمَعُونِ | (یس : ٢٥) وتی : جا بەرد بارانیان کرد هەتا کوشتیان، جا چووە بەهەشت و وتی : | قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ * بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ : خۆزگە گەلەکەم ئەیانزانی بەوەی پەروەردگارم لێم خۆش بووە و خستوومیەتیە ڕیزی ڕێزلێگیراوانەوە | (یس : ٢٦ - ٢٧) .

---

: ئەثەری ١٩ باسی بەسەرهاتی ئەو پیاوە ئەکات کە بە هات بۆلای پێغەمبەر موسی علیه السلام و پێی وت بەتەمان بتکوژن .

**٢٠ - إبن أبي زمنين** المالكي (**٣٢٤ - ٣٩٩ هـ**) لە ڕوونكردنەوەی عەقیدەی ئەهلی سوننەدا ئەڵێت : ئەهلی سوننە باوەڕیان بەوە هەیە كە بەهەشت و جەهەننەم لەناو ناچن، وە ئەهلەكەی ناویان نامرن، - پاشان چەندین ئایەت ئەهێنێتەوە بۆ چەسپاندنی عەقیدەی ئەهلی سوننە لەو بابەتەدا، وە دواتر لەبارەی مانەوەی هەتا هەتایی موسوڵمانان لە بەهەشت و كافرەكان لە جەهەننەمدا ئەڵێت : -ئەگەر الله تبارك وتعالى لە مانەوەی هەتایی دا (الخلود) تەنها یەک ئایەتی باسكردایە ئەوە بەس بوو بۆ ئەو كەسەی كە الله سنگی فراوان كردووە بۆ ئیسلام، بەڵام دووبارەی كردووەتەوە - واتە لە چەند ئایەتێكدا باسی كردووە - بۆ ئەوەی بەڵگەی زاڵ هەر بۆ خۆی بێت .

**٢١ - رسول الله** ﷺ ئەفەرموێت : (لە ڕۆژی قیامەتدا مردن ئەهێنرێت، لەسەر پردی سیراط ئەوەستێنرێت، ئەوترێت : ئەی ئەهلی بەهەشت، جا بە ترسەوە تەماشا ئەكەن، لەوە ئەترسن لەو شوێنە بهێنرێنە دەرەوە كە تیایدان، وە ئەوترێت : ئەی ئەهلی ئاگر، جا بە دڵخۆشیەوە تەماشا ئەكەن، دڵیان بەوە خۆشە لەو شوێنە دەربهێنرێن كە تیایدان، جا پێیان ئەوترێت -واتە بە بەهەشتی و جەهەننەمیەكان - : ئەزانن ئەمە چییە ؟ ئەڵێن : بەڵێ پەروەدگارمان، ئەوە مردنە، جا فەرمان ئەكرێت و لەسەر پرسی سیراط سەرئەبڕدرێت، پاشان بە هەردوو كۆمەڵەكە ئەوترێت : بە هەتا هەتایی ئەمێننەوە لەو شوێنەی كە تێیدان، هەرگیز مردنی تێدا نییە) .

**٢٢ - عبدالله بن عمرو** رضي الله عنهم ئەفەرموێت : هیچ ئایەتێک دانەبەزیوە لەبارەی ئەهلی ئاگرەوە هێندەی ئەمە توند و قورس بێت : | فَذُوقُوا فَلَنْ نَزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا | (النبأ : ٣٠) .

عبدالله وتی : جا بە هەتا هەتایی عەزاب و سزایان بۆ زیاد ئەكرێت .

٢٣ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (مەلائیکە ئەڵێت : ئەی پەروەردگارم، ئەوە بەندەکەتە ئەیەوێت گوناهێک ئەنجام بدات، وە خۆشت باشتر ئەیبینیت، جا - الله عز وجل - ئەفەرمووێت : چاودێری بکەن، ئەگەر کردی ئەوە ئەوەندەی گوناهەکە لەسەری بنووسن، وە ئەگەر نەیکرد و وازی لێ هێنا ئەوە چاکەیەکی بۆ بنووسن، چونکە لەبەر ترسی من وازی لێ هێناوە).

٢٤ - **سفیان** ئەڵێت : پێم گەیشتووە کاتێک جەهەنەمیەکان ئەهێنرێنە دەرەوە و تەنها ئەوانە لە جەهەنەمدا ئەمێننەوە کە بۆیان دانراوە بە هەتا هەتایی لەوێ بمێننەوە، لەوکاتەدا ئەوانەی لەناو جەهەنەمدان ئەڵێن : | رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ : پەروەردگارمان لەم ئاگرە دەرمانکە ئەگەر ئەمجارە گەڕاینەوە بۆ کوفر و شیرک ئەوا ئێمە کەسانێکی ستەمکارین |، جا الله ئەفەرمووێت : | قَالَ اخْسَئُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ : بێدەنگ بن تیایدا و و قسەم لەگەڵ مەکەن |، جا هەر کە وای فەرموو سەریان دائەپۆشرێت و هیچ کەسێکیان لە جەهەنەم دەرناچێت .

٢٥ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (دوو وشە هەن ئاسانن لەسەر زمان، قورسن لەسەر تەرازوو، وە لەلای الرحمن خۆشەویستن : سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم).

٢٦ - **سلمان الفارسي** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : لە ڕۆژی قیامەتدا تەرازوو - المیزان - دائەنرێت، ئەگەر لە لایەکی ئاسمانەکان و زەوی دابنێرێت ئەوە جێگەی ئەبێتەوە، جا مەلائیکەکان ئەڵێن : پەروەردگارمان بۆ کێ بەمە ئەکێشرێت ؟ جا

ئەفەرمووێت : بۆ ئەوەی بمەوێت لە دروستکراوەکانم، جا مەلائیکەکان ئەڵێن : پاکی و بێگەردی بۆ تۆ، بەو شێوە نەمانپەرستیت کە شایەنی تۆیە .

**٢٧ - رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (شەفاعەتی من بۆ ئەهلی تاوانە گەورەکانە لە ئوممەتەکەم) .

**٢٨ - رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (قیامەت هەڵناستێت هەتا خۆر لە شوێنی خۆرئاوابوونیەوە هەڵدێت، جا کاتێک خەڵکی ئەمە ئەبینن هەموویان ئیمان ئەهێنن، لەو ڕۆژەدا هیچ کەسێک سوود لە ئیمانەکەی نابینێت ئەگەر پێشتر ئیمانی نەهێنابێت، یان خێرێکی لە ئیمانەکەی نەبینیبێت - واتە کردەوەی خێر سوودی نییە ئەوکاتە، والله أعلم - ) .

**٢٩ - إبن مسعود** رضي الله عنە ئەفەرمووێت : ئەهلی ئاگر بە ئەو ئەهلی تەوحیدانە ئەڵێن کە چوونەتە ناو ئاگرەوە : (ئا ئەوانە موسوڵمان بوون، چ سوودێکیان پێ گەیشت ؟)، جا الله تعالی هەڵوێستە ئەکات و ئەیانخاتە بەهەشتەوە، جا لەو کاتەدا : ﴿يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمِينَ﴾ : کافرەکان ئاواتەخوازن موسوڵمان بوونایە (الحجر : ٢) .

**٣٠ - رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (دەرگای تۆبەکردن لەلای خۆرئاوا کراوەتەوە) یان (لە خۆرئاوا دەرگای تۆبەکردن کراوەیە، فراوانیەکەی پێنجسەد ساڵە، بە کراوەیی بۆ تۆبەکردن ئەمێنێتەوە هەتا ئەو کاتەی خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت، جا کە هەڵهات دائەخرێت) .

**٣١** - **إبن عباس** رضي الله عنهما ئەفەرموویت : (ئەو شەوەی کە بەیانیەکەی خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت درێژیەکەی هێندەی سێ شەوە ) .

**٣٢** - **إبن عباس** رضي الله عنهما ئەفەرموویت : (رسول الله ﷺ ئەم دوعایەی فێر ئەکردن وەک چۆن سورەتێک لە قورئانی فێر ئەکردن : اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ, أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ, أَعُوذُ بِكَ مِن فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، أَعُوذُ بِكَ مِن فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ ) .

**٣٣** - **رسول الله** ﷺ ئەفەرموویت : (ئایا باسی دەججالتان بۆ بکەم بە باسکردنێک کە پێغەمبەرێک پێش من باسی نەکردووە ؟ چاوێکی کوێرە، وە دێت و نمونەی بەهەشت و جەهەننەمی پێیە، جا ئەوەی کە پێی ئەڵێت بەهەشت ئەوە جەهەننەمە، ئەوەشی پێی ئەڵێت جەهەننەم ئەوە بەهەشتە، وە منیش ئاگادارتان ئەکەمەوە وەک چۆن نوح قەومەکەی ئاگادار کردەوە ) .

**٣٤** - **إبن عمر** ئەفەرموویت رسول الله ﷺ باسی مەسیحی دەججالی کرد لەناو خەڵکیدا و فەرمووی : (الله چاوێکی کوێر نییە، وە مەسیحی دەججال چاوی ڕاستی کوێرە، وەکو دەنکە ترێیەکی تەقیو وایە ) .

**٣٥** - **عمر بن ثابت الأنصاري** ئەڵێت کە هەندێک لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ پێیان ڕاگەیاندووە کە پێغەمبەر ﷺ خەڵکی ئاگادار کردەوە لە فیتنەی دەججال و فەرمووی : (هیچ کەسێک لە ئێوە پەروەردگاری نابینێت هەتا نەمرێت، وە لە ناوچاوانی نووسراوە کافر، ئەوەی ڕقی لە کار و کردەوەکەی بێت ئەخوێنێتەوە ) .

**٣٦ - عمر بن الخطاب** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ڕەجم كردن حەددێكە لە حەددەكانی الله، جا نەتانخەڵەتێنن، چونكە قەومێک دێن ڕەجم و دەججال و تەرازوو و حەوز و هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاوایەوە و شەفاعەت و كۆمەڵەیەک لە جەهەننەم دێنە دەرەوە بەدرۆ ئەخەنەوە) .

**٣٧ - إبن أبي زمنين** ئەڵێت : (ئەهلی سوننەت باوەڕیان بە دابەزینی عیسا و كوشتنی دەججال هەیە) .

- الله عز وجل ئەفەرمووێت : | وَإِنَّهُ لَعَلَمٌ لِلسَّاعَةِ : وە ئەو نیشانەیەكە بۆ كۆتایی دنیا | : (واتە عیسى) .

- الله عز وجل ئەفەرمووێت : | وَإِنْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ: وە هیچ كەسانێک نین لە ئەهلی كیتاب ئیللا ئیمانی پێ ئەهێنن پێش مردنی | : (واتە پێش مردنی عیسى) .

**٣٨ - قتادة** لە تەفسیری ئایەتی : | وَإِنْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ : هیچ ئەهلی كیتابێک نییە ئیللا ئیمانی پێ ئەهێنێت پێش مردنی | .

ئەڵێت : (پێش مردنی عیسى كاتێک دابەزی) .

وە لە تەفسیری : | وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا : وە ڕۆژی قیامەتیش ئەبێت بە شایەت بەسەریانەوە | .

ئەڵێت : (بەوەی کە پەیامەکانی پەروەردگاری گەیاندووە و دانی ناوە بە بەندایەتی خۆی) .

**٣٩ - إبن أبي زمنين المالكي (٣٢٤ - ٣٩٩ هـ)** ئەڵێت : (وە لە وتەی ئەهلی سوننە یە کە : هەموو قەدەرەکان ، بە خێر و بە شەڕیەوە ، بە خۆش و بە ناخۆشیەوە لەلایەن الله عز وجل ەوەن ، وە دروستکراوەکانی دروست کردووە ، وە ئەشیزانی کە چی ئەنجام ئەدەن و بەرەو چی ئەچن ، جا لەبەر ئەوە هیچ ڕێگریکارێک نییە لەوەی کە ئەیبەخشێت ، وە هیچ بەخشەرێک نییە لەوەی کە ڕێگری لێ ئەکات).

**٤٠ - رسول الله ﷺ** ئەفەرمووێت : (الله قەدەری هەموو دروستکراوەکانی نووسی پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات بە پەنجا هەزار ساڵ ، وە عەرشەکەی لەسەر ئاو بوو) .

**٤١ - رسول الله ﷺ** ئەفەرمووێت : (کەسی وا هەیە خەڵکی وا ئەیبینن کە کار و کردەوەی ئەهلی بەهەشت ئەکات ، بەڵام لە ئەهلی جەهەننەمە ، وە کەسی وا هەیە خەڵکی وا ئەیبینن کە کار و کردەوەی ئەهلی جەهەننەم ئەکات ، بەڵام لە ئەهلی بەهەشتە) .

**٤٢ - سعيد بن جبير** لە تەفسیری ئایەتی : | مَّآ أَصَابَكَ مِنۡ حَسَنَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٖ فَمِن نَّفۡسِكَۚ : هەر خێرێکت تووش بوو ئەوە لە الله وەیە ، وە هەر ناخۆشی و خراپەیەکت تووش بوو ئەوە لە نەفسی خۆتەوەیە | (النِّسَاء : ٧٩) .

ئەڵێت : ( - الله تعالى ئەفەرمووێت - : بەهۆی تاوانی خۆتەوەیە ، وە من بە قەدەر دامناوە لەسەرت) .

: مەبەست لە ئایەت و تەفسیرەکەی ئەوەیە کە : (هەر چاکەیەک کە تووشت ئەبێت ئەوە الله تعالى فەزڵی بەسەردا کردوویت، وە هەر خراپە و ناخۆشیەکت تووش ئەبێت ئەوە بەهۆی ئەو تاوان و خراپانەیە کە کردووتن لە پێشتردا، واتە هۆکاری ئەو ناخۆشیانەی بەسەرتدا دێن هەر خۆتیت، وە الله تعالى خێر و شەڕ، وە خۆشی و ناخۆشی هەردووکیان لە قەدەری بەندەکان نووسیوە).

٤٣ - **إبن أبي زمنين المالكي** (٣٢٤ - ٣٩٩ ﻫ) ئەڵێت : (وە لە وتەی ئەهلی سوننە یە کە : ئیمان موخلیص بوونی دڵەکانە بۆ الله، وە شایەتیدانە بە زمانەکان، وە کار و کردەوەیە بە ئەندامەکان، لەسەر نیەتێکی باش و پێکانی سوننەت).

٤٤ - **عمير بن حبيب** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئیمان زیاد و کەم ئەکات، پێیان وت : زیادکردن و کەمکردنی چۆنە ؟

فەرمووی : کاتێک یادی الله ئەکەینەوە الحمدلله و سبحان الله ئەکەین، ئەوە زیادبوونەکەیەتی، وە کاتێک یادی نەکەین و لەبیرمان بچێت ئەوە کەمبوونەوەکەیەتی).

٤٥ - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (هیچ شتێکمان نەئەوت دەربارەی کەسێک هەتا نەمانبینیایە لەسەر چ حاڵێک ئەمرێت، ئەگەر کۆتاییەکەی باش بووایە هیواداربووین باشەی تووش ببێت، وە ئەگەر کۆتاییەکەی بە بێجگە لەوە بووایە ئەترساین لێی).

: (وە ئەگەر كۆتاییەکەی بە بێجگە لەوە بووایە ئەترساین لێی) واتە ئەگەر كۆتاییەکەی بەخراپە بووایە واتە ئاخر شەڕ بووایە ئەترساین لەوەی تووشی سزای الله عز وجل بێت .

**٤٦ - رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (شیرک شاراوەترە لە تەپەی پێی مێروولە لەسەر بەردێک) .

أبو بكر الصديق رضي الله عنه وتی : (إنا لله وإنا إليه راجعون) .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئایا شتێکت فێر بکەم ئەگەر وتت نەجاتت ببێت لە شیرک ؟) .

وتی : (بەڵێ ئەی رسول الله) .

فەرمووی : بڵێ (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أُشْرِكَ بِكَ وَأَنَا أَعْلَمُ، وَأَسْتَغْفِرُكَ لِمَا لاَ أَعْلَمُ) .

**٤٧ -** الله عز وجل ئەفەرمووێت : ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾، إبن عباس وەڵامی پرسیارکەرێکی دایەوە کە پرسیاری لێکردبوو دەربارەی فەرمووی : (کوفرێک نییە کە بیکاتە دەرەوە لە ئیسلام) .

**٤٨ - عريب الهمداني** ئەڵێت : وتم بە إبن عمر : ئێمە کە ئەچینە لای دەسەڵاتداران پیایاندا هەڵئەدەین بەوەی کە تیایاندا نییە، ئەگەریش لەلایان نەماین دووعایان لێ ئەکەین .

وتی : (ئێمە ئەوەمان بە نیفاق حساب ئەکرد) .

**٤٩ - إبن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (گۆرانی نیفاق لە دڵدا ئەڕوێنێت ، وەک چۆن ئاو ڕووەک ئەڕوێنێت ) .

**٥٠ - رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (**هەر كەسێک بە مودمینی** - مُدمِناً - **مەی بمرێت، وەكو بتپەرستێک مردووە**) .

- إبن أبي زمنين لە تەفسیری ئەم فەرموودەدا ئەڵێت : (الإِدمَان لەلای ئەهلی عیلم واتە ئەو كەسەی ئەیخواتەوە نیەتی بەردەوام بوونی هەبێت ئەگەرچی ساڵی جارێک بیخواتەوە، ئەگەر نیەتی ئەوەبوو دووبارە بگەڕێتەوە سەری ئەوە مودمینە ) .

**٥١ - رسول الله** ﷺ فەرمووی : (بەیعەتم پێ بدەن بەوەی كە شەریک بۆ الله دانەنێن، وە دزی نەكەن، وە زینا نەكەن، هەركەسێک وەفادار بێت بەرامبەر بەڵێنەكەی پاداشتەكەی لەسەر الله یە، هەركەسێكیش شتێک لەوانەی تووش بوو پاشان سزای درا ئەوە كەفارەتەكەیەتی ، وە هەركەسێكیش شتێكی وای تووش بوو و الله بۆی داپۆشی ئەوە ئەگەڕێتەوە بۆلای الله ، ئەگەر ویستی لێبێت سزای ئەدات، ئەگەر ویستی لێبێت لێی خۆش ئەبێت ) .

**٥٢ - علي بن أبي طالب** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (فەقیهـ و تێگەیشتووی ڕاستەقینە ئەو كەسەیە كە خەڵكی بێئومێد ناكات لە ڕەحمی الله ، وە بواریان نادات لە سەرپێچیەكانی الله عز وجل دا) .

**٥٣** - **إبن أبي زَمنِين المالكي** ئەڵێت : (لە وتەی ئەهلی سوننە یە کە : مرۆڤ لەدڵیەوە هاوەڵانی رسول الله ی ﷺ خۆشبوویت، وە چاکە و فەزڵەکانیان بڵاو بکاتەوە، وە دەمی بگرێتەوە لە باسکرنی ئەو شتانەی لە نێوانیاندا ڕوویداوە) .

**٥٤** - **رسول الله** ﷺ ئەفەرموویت : (**باشترینی ئوممەتەکەم سەردەمی منە، پاشان ئەوانەی کە لەدوایان دێن، پاشان ئەوانەی کە لەدوایان دێن**) .

**٥٥** - النضر ئەگێڕێنەوە لە أبي قلابە، لە عبدالله بن مسعود کە وتی **رسول الله** ﷺ فەرمووی : (**ئەگەر باسی قەدەر کرا بێدەنگ بن، ئەگەر باسی ئەستێرەکان کرا بێدەنگ بن، ئەگەر باسی هاوەڵانم کرا بێدەنگ بن**) .

**٥٦** - النضر ئەڵێت گوێم لە **أبي قلابة** بوو بە أيوب -السختياني- وت : (ئەی أيوب، ئەم سێ شتەی ئەیڵێم لەبەری بکە :

- لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوودا دامەنیشە، وە گوێیان لێ مەگرە .
- وە قورئان بە ڕەئی خۆت لێکمەدەرەوە، چونکە ئەوە ئیشی تۆ نییە .
- وە تەماشای هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بکە، وە تەنها بە باشە و خێر باسیان بکە)

.

**٥٧** - **رسول الله** ﷺ ئەفەرموویت : (**دوعا بۆ هاوەڵەکانم بکەن، قسەی خراپ بە هاوەڵەکانم مەڵێن، ئەگەر یەکێکتان هەموو ڕۆژێک ئەوەندەی کێوی ئوحود ببەخشێت ناگات بە مشتی یەکێکیان، وە بگرە نیوەی**) .

**٥٨ - أيوب السختياني** ئەڵێت : ( . . . وە هەرکەسێک بەباشی وەسفی هاوەڵانی رسول الله ی ﷺ کرد ئەوە بەری بووە لە دووڕوویی، وە هەر کەسێک لە یەکێکیان کەم بکاتەوە یان ڕقی لە شتێک بێت کە لێی ڕوویداوە ئەوە بیدعەچیە، پێچەوانیکاری سوننەت و سەلەفی ساڵحە، وە ترس هەیە لەسەری کە هیچ کردەوەیەکی بەرز نەکرێتەوە بۆ ئاسمان هەتا هەموویانی خۆش ئەوێت و دڵی بەرامبەریان سەلیم و چاک ئەبێت ) .

**٥٩ - إبن أبي زَمِنِين المالكي** ئەڵێت : (لە وتەی ئەهلی سوننە یە کە : باشترینی ئەم ئوممەتە لەدوای پێغەمبەرمان ﷺ بریتین لە : أبو بكر و عمر، وە باشترینی خەڵکی دوای ئەوان بریتین لە : عثمان و علي ) .

٦٠ - **رسول الله ﷺ** ئەفەرموویێت : (الله هاوەڵانی منی هەڵبژارد بەسەر هەموو جیهانیاندا بێجگە لە پێغەمبەران و نێردراوەکان، وە چوار دانەی لە هاوەڵانم بۆ هەڵبژاردم : أبو بكر و، عمر و، عثمان و علي، کردوونی بە باشترینی هاوەڵانم، وە هەموو هاوەڵانم باشن، وە ئوممەتەکەی منی هەڵبژاردووە بەسەر ئوممەتەکانی تردا) .

٦١ - **عبدالله بن المبارك** ئەڵێت : (ئیجماعی هاوەڵانی رسول الله ﷺ وەرئەگرین و واز لە بێجگە لەوە ئەهێنین، بەڕاستی کۆدەنگ بوون لەسەر ئەوەی کە عثمان باشترینیانە لەم ئوممەتەدا پاش أبو بكر و عمر، وە پاش ئەوان علي، وە باشترینی ئەم ئوممەتە دوای ئەو چوارە هاوەڵانی شوران، پاشان ئەهلی بەدر، پاشان ئەوانەی کە زووتر موسوڵمان بوون لە هاوەڵانی دیکەی پێغەمبەر، حەقی زوو موسوڵمانبوونیان لەپێشچاو ئەگرین ) .

٦٢ - **محمد بن المنكدر** ئەڵێت : کاتێک بەیعەت درا بە یزید بن معاوية باسی ئەمە لەلای إبن عمر کرا، جا فەرمووی : (ئەگەر باش بێت ئەوە ڕازی ئەبین پێی، وە ئەگەر خراپ بوو لەوە ئارامی لەسەر ئەگرین).

٦٣ - **محمد بن وضاح** وتی پرسیارم لە حارث المسكين کرد : ئایا نوێژ واز لێ ئەهێنرێت لەدوای بیدعەچیەکانەوە ؟

وتی : (جومعە نا، بەڵام بۆ نوێژەکانی تر بەڵێ).

٦٤ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (جیهاد بەردەوامە لەو کاتەوەی الله ناردوومی هەتا کۆتایی ئوممەتەکەم کە شەڕ لەگەڵ دەججالدا ئەکەن، ستەمی ستەمکارێک وە دادپەروەری دادپەروەرێک پووچەڵی ناکاتەوە).

٦٥ - بۆ **عبدالله بن عباس** باس کرا کە هەندێک کەس قسە ئەکەن لە قەدەردا، جا باسی هەندێک لە قسەکانیان کرا بۆی، فەرمووی : ئایا لە ماڵی مندا کەسێکی لەوانی لێیە هەتا بۆی هەڵبستمەوە و ملی لێبکەمەوە ؟

٦٦ - پیاوێک پرسیاری لە **إبراهيم النخعي** کرد دەبارەی ئەهلی هەوا و ئارەزوو : ئایا باشن ؟

وتی : (الله هێندە مسقاڵە زەڕەیەک خێر و باشیی لە هیچکامیاندا دانەناوە، وە ئەوانە هیچ نین جگە لە ڕازاندنەوە و جوانکردنی شەیتان نەبێت، ...).

٦٧ - **عطاء بن أبي رباح** دەربارەی ئەهلی هەوا و ئارەزوو بەو کەسانەی وت کە لەلای دانیشتبوون : (ئەگەر یەکێکتان بینی لەوان لە مەجلیسەکەمان دانیشت بە

ئاماژە پێم بڵێن)، ئاماژەکە - نهێنی بوو - لە نێوان خۆیاندا بوو، جا ئەگەر یەکێک لەوان لە مەجلیسەکە دابنیشتایە ئاماژەیان بۆ ئەکرد ئەویش نەعلەکەی ئەگرت بە دەستیەوە و بۆی هەڵئەستا .

٦٨ - **أبو قلابة** وتی : (لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوودا دامەنیشن، وە موناقەشەیان لەگەڵ مەکەن، چونکە من ئەمین نیم لەوەی هەڵتان بکێشن لە گومڕایەتیەکەیان، یان گومانتان بۆ دروست بکەن دەربارەی شتێک کە ئەتانزانی) .

٦٩ - **أبي الجوزاء** وتی : (ئەگەر مەیمون و بەراز ببێت بە دراوسێم ئەوە پێم خۆشترە لەوەی کەسێکی خاوەن هەوا و ئارەزوو ببێت بە دراوسێم . . .) .

٧٠ - **مجاهد** وتی : (نازانم کام دوو نیعمەتە گەورەترن بۆم، ئەوەی کە - الله تعالى - هیدایەتی داوم بۆ ئیسلام؟ یاخود ئەوەی کە لە هەوا و ئارەزوو بەدووری گرتووم؟) .

٧١ - سحنون لە إبن القاسم ـەوە وتی : **مالک** وتی : (هیچ ئایەتێک نییە لە قورئاندا هێندەی ئەم ئایەتە توند بێت لەسەر ئەهلی هەوا و ئارەزوو : ﴿يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ۚ فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ (آل عمران : ١٠٦) .

مالک وتی : (چ قسەیەک لەمە ڕوونترە؟ - واتە لە ئایەتەکە - ) .

- إبن القاسم ئەڵێت **مالک** پێی وتم : (ئەم ئایەتە دەربارەی ئەهلی قیبلە - واتە موسوڵمانان - دابەزیوە) .

**٧٢ -** سحنون ئەڵێت : (**إبن غانم** دەربارەی کەراهیەتی دانیشتن لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوودا ئەڵێت : ئەگەر یەکێک لە ئێوە دابنیشێت لەلای دزێک و شتێک لە دەستیدا بێت، ئایا لێی دوورناخاتەوە و ناپارێزێت لەبەر ئەوەی دزەکە نەیبات ؟ جا دینەکەتان لەپێشترە تا دووریبخەنەوە و بیپارێزن .

وترا : ئەگەر لەگەڵیاندا لە سەنگەرێکدا بووین دەریان بکەین ؟

وتی : بەڵێ ) .

**٧٣ -** سحنون وتی : أشهب وتی : پرسیار لە **مالک** کرا دەربارەی قەدەرییەکان ؟

وتی : (کۆمەڵەیەکی خراپن، دامەنیشن لەگەڵیان ) .

وترا : وە نوێژ لە پشتیان ناکرێت ؟

وتی : (بەڵێ ) .

**٧٤ -** **إبن أبي الزناد** لە **باوکیەوە** ئەگێڕێتەوە : (لە خەلافەتی عمر بن عبدالعزیز دا حەرورییەکان لە عێراق خروجیان کرد، وە من ئەو ڕۆژە لەگەڵ عبدالحمید بن عبدالرحمن بن زید بن الخطاب دا بووم، جا عمر بن عبدالعزیز نامەی بۆ نووسین تێیدا فەرمانی پێکردین بەوەی بانگیان بکەین بۆلای کار کردن بە کتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ، پاشان دوای ئەوەی بێئومێد بوو لە بانگکردنیان نامەی بۆ نووسین کە لەگەڵیان بجەنگین چونکە الله - وله الحمد - هیچ سەلەفێکی بۆ دانەناون هەتا بیکەن بە بەڵگە بەسەرمانەوە، عبدالحمید سوپایەکی بۆ ناردن، حەرورییەکان بەزاندنیان، کاتێک ئەمە گەیشت بە عمر مسلمة بن عبدالملک ی بۆ ناردن لەگەڵ سوپایەک لە ئەهلی شام، وە بۆ عبدالحمید ی نووسی : (پێم گەیشت دەربارەی

سوپاکەت کە چیيان کردووە، سوپايەکی باش نین، مسلمة بن عبدالملک م ناردووە بۆ لات وازی لێ بهێنە)، جا مسلمة پێیان گەیشت، الله تعالى سەریخست بەسەریاندا و بە ئەو دەستەمۆی کردن).

**٧٥** - إبن عباس رضي الله عنها ئەفەرمووێت: بیستم **عمر بن الخطاب** لەسەر مینبەر ئەیفەرموو: (لەم ئوممەتەدا کۆمەڵەیەک ئەبن کە ڕەجم کردن بە ڕاست نازانن، وە دەججال بە ڕاست نازانن، وە هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاوایەوە بە ڕاست نازانن، وە عەزابی قەبر بە ڕاست نازانن، وە شەفاعەت بە ڕاست نازانن، وە دەرچوونی کۆمەڵەیەک لە جەهەننەم دوای ئەوەی بوون بە خەڵوز بە ڕاست نازانن، جا ئەگەر پێیان بگەم ئەوە وەکو کوشتنی عاد و ثمود ئەیانکوژم).

**٧٦** - **عبدالملک** وتی: (هەر کەسێک عەزابی قەبر بە ڕاست نەزانێت، یان هەر شتێک لەوەی کە عمر باسی کرد ئەوە تەوبەی پێ ئەکرێت، ئەگەر تۆبەی نەکرد ئەکوژرێت).

**٧٧** - **عیسی** وتی: (هەر کەسێک بڵێت الله قسەی لەگەڵ موسی ىدا نەکردووە ئەوە تۆبەی پێ ئەکرێت، ئەگەر تۆبەی نەکرد ئەکوژرێت، ئەوە بەلامەوە حەق و واجبە، وە دینداریێتی الله بە ئەوە ئەکەم).

**٧٨** - العتبي وتی: پرسیار لە **سحنون** کرا دەربارەی ئەو کەسەی ئەڵێت: (جبریل هەڵەی کرد لە وەحیدا، بەڵکو علي بن أبي طالب پێغەمبەر بوو، بەڵام جبریل هەڵەی کرد لە وەحیدا! ، ئەهلی ئەوەیە تۆبەی پێ بکرێت؟ یان بکوژرێت و تۆبەی پێ نەکرێت؟

وتی: (بەڵکو تۆبەی پێ ئەکرێت، ئەگەر تۆبەی نەکرد لە ملی ئەدرێت).

وترا : ئەی ئەگەر قسەی خراپی وت بە یەکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ : أبو بكر، وە عمر، يان عثمان، يان علي، يان معاوية، يان عمرو بن العاص ؟

پێی وتم : (ئەگەر قسە ناشرینەکەی ئەوە بوو پێیان بڵێت گومڕا بوون یان کافر ئەوە ئەکوژرێت، بەڵام ئەگەر قسەی ناشرینی پێ وتن بە بێجگە لەمە وەک چۆن قسەی ناشرین بە خەڵکی ئەڵێت ئەوە پێم وایە بە توندی سزایان ئەدرێت و ئەکرێن بە پەند) .

**٧٩** - پیاوێک لە عەرەب بۆ **مالک** ی نووسی پرسیاری ئەکرد دەربارەی کۆمەڵەیەک کە دوو ڕکعات نوێژ ئەکەن، وە سوننەت بەدرۆ ئەخەنەوە، وە ئەڵێن ئێمە وامانبینیوە نوێژ تەنها دوو ڕکعات بێت ؟

مالک وتی : (پێم وایە تۆبەیان پێ بکرێت، ئەگەر تۆبەیان نەکرد ئەکوژرێن) .

والحمد لله رب العالمين

